## ستانداردەکانی یاریدەدەری بەڕێوەبەر

| بوارەکانی ئەدا | ستانداردەکان | نیشاندەرەکانی ئەدا |
|---|---|---|
| زانین | ١. یاریدەدەر فەلسەفەو سیاسەت و ئامانجەکانی پەروەردە دەزانێت. | ١.١ یاریدەدەر سیاسەت و ئامانجە پەروەردەییەکان جێبەجێ دەکات بە پێی فەلسەفەی پەروەردەیی لە وولاتدا . |
| | ٢. یاریدەدەر زانستی ڕێگاکانی وانە وتنەوەی نوێ دەزانێت. | ١.٢ یاریدەدەر هاوکاری بەڕێوەبەر دەکات لە بەدواداچونی جێبەجێکردنی ڕێگاکانی وانە وتنەوەی نوێ .<br>٢.٢ یاریدەدەر هاوکارە بۆ خستنە ڕووی ڕێگاکانی وانە وتنەوەی نوێ بۆ مامۆستایان. |
| | ٣. یاریدەدەر کاروبارە کارگێڕی و ڕێنماییە یاسایەکان کە پەیوەندیان بە بەڕێوەبردنی قوتابخانەوە هەیە دەزانێت. | ١.٣ یاریدەدەر ڕێساو ڕێنماییەکان و یاساکانی پەیوەست بە قوتابخانەو فەرمانەکانی وەزارەت دەزانێت و هاوکارە لە جێبەجێکردنیان .<br>٢.٣ یاریدەدەر هاوکارە لە بەدواداچوون بۆ جێبەجێکردنی ڕێنمایەکان لە قوتابخانە بە شێوەیەکی دروست.<br>٣.٣ ئەو زانیارییانەی یاریدەدەر هەیەتی لە بوارەکانی کارگێڕی و هونەری ڕەنگدەداتەوە لە کاتی بەڕێوەبردنی کارەکانی . |
| | ٤. یاریدەدەر شێوازەکانی سەرکردایەتی کردنی قوتابخانە دەزانێت. | ١.٤ یاریدەدەر شێوازە جیاوازەکانی سەرکردایەتی کردن و بەڕێوەبردنی قوتابخانە دەزانێت و بەکاریان دەهێنێت و هاوکارە لە هەڵسەنگاندن و بەدواداچوونی کارەکان.<br>٢.٤ یاریدەدەر ئەو دەسەڵاتانەی پێدراوە بە شێوەیەکی دروست بەکاریان دەهێنێت بۆ خزمەت کردنی قوتابیان و فێربوونیان. |
| | ٥. یاریدەدەر بارودۆخی ماڵەوەی قوتابیان و ئەو ژینگەو دەوروبەرەی کە تیایدا دەژیەن و چۆنیەتی مامەڵەی دروست لەگەڵ قوتابیان دەزانێت. | ١.٥ یاریدەدەر زانیاری هەیە لەسەر ئەو ژینگە کۆمەڵایەتیەی کە قوتابخانەکەی تێدایە.<br>٢.٥ یاریدەدەر ئاگادارە لەو ڕەوشەی کە قوتابیان تیایدا دەژیەن.<br>٣.٥ یاریدەدەر پەیوەندی کۆمەلایەتی پتەوی لە گەل قوتابییاندا هەیە . |
| | ٦. یاریدەدەر زانیاری هەیە لە تەکنەلۆژیای نوێ ی پەیوەست بە کاروباری قوتابخانە هەیە. | ١.٦ یاریدەدەر زانیاری هەیە لە سەر سیستەمی داتا بێیس .<br>٢.٦ یاریدەدەر زانیاری هەیە لە هۆیەکانی فێرکردنی سەردەمیانەی پەیوەست بە قوتابخانەو کارەکانی خۆی .<br>٣.٦ یاریدەدەر زانیاری هەیە لە سەر هۆیەکانی پەیوەندی و گەیاندنی سەردەمیانە. |
| کارامەییەکان | ١– یاریدەدەر دەتوانێت هاوکاری بکات لە سەرکردایەتی کردنی کرداری فێربوون و فێرکردن. | ١.١ یاریدەدەر هەوڵ دەدات کە فێربوون و فێرکردن لە ئاستێکی بەرز دابێت.<br>٢.١ یاریدەدەر هاوکاری دەکات لە چاودێری کردنی ئاستی فێرکردن و فێربوون .<br>٣.١ یاریدەدەر هاوکارە لە هەڵسەنگاندنی ئاستی فێربوون.<br>٤.١ یاریدەدەر هانی مامۆستایان دەدات بۆ بە کارهێنانی ڕێگاکانی وانەوتنەوەی نوێ. |
| | ٢. یاریدەدەر دەتوانێت زەمینەیەکی گونجاو لە قوتابخانە دابین بکات. | ١.٢ سەرجەم لایەنە پەیوەندیدارەکان متمانەیان بە یاریدەدەر هەیە .<br>٢.٢ یاریدەدەر هاوکارە لە چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان .<br>٣.٢ یاریدەدەر لەگەڵ هەموو ئەندامانی کۆمەڵگەی قوتابخانەدا بەڕێزەوە مامەڵە دەکات. |

| | | |
|---|---|---|
| | | ٤.٢ یاریدەدەر لەگەڵ مامۆستایان و کارمەندانی قوتابخانە وەك یەك تیم کاردەکەن. |
| | ٣. یاریدەدەر دەتوانیت ژینگەیەکی سەلامەت و تەندروست دابین بکات. | ١.٣ یاریدەدەر هەوڵدەدات ژینگەی قوتابخانە پاك و تەندروست بێت.<br>٢.٣ یاریدەدەر زانیاری هەیە لەسەر باری تەندروستی قوتابیان و بەدواداچون دەکات. |
| | ٤. یاریدەدەر دەتوانێت هاوکار بێت لە پلانی پەرەپێدانی قوتابخانە. | ١.٤ یاریدەدەر چالاکانە بەشداری لە داڕشتنی دیدو پەیامی قوتابخانە دەکات .<br>٢.٤ یاریدەدەر ڕۆڵی هەیە لە چاودێری کردن و جێبەجێکردنی پلانی پەرەپێدانی قوتابخانە. |
| | ٥. یاریدەدەر دەتوانێت بە ڕاوێژ کردن و بڕیاردان لەگەڵ بەڕێوەبەرو مامۆستایان و کارمەندانی تر بەشداری کارای هەبێت بۆ بەرەوپێشچوونی کاروبارەکانی قوتابخانە. | ١.٥ یاریدەدەر ڕاوێژ لەگەڵ و مامۆستا و کارمەندان دەکات و تێبینیەکانیان بە هەند وەردەگرێت.<br>٢.٥ یاریدەدەر چالاکانە بەشداری لە لێژنەکانی قوتابخانە دەکات . |
| | ٦. یاریدەدەر دەتوانیت سەرچاوەکانی قوتابخانە بە شێوەیەکی کاریگەر و گونجا و بەکار بهێنێت | ١.٦ یاریدەدەر سوود لە تواناکانی مامۆستایان و کارمەندانی قوتابخانە وەردەگرێت.<br>٢.٦ یاریدەدەر هاوکارە بۆ دابین کردنی سەرچاوەی پێویست بۆ قوتابیان و کارمەندان<br>٣.٦ یاریدەدەر هاوکارە لە پاراستنی کەلوپەلەکانی قوتابخانە .<br>٤.٦ یاریدەدەر هاوکارە بۆ دابین کردنی سەرچاوەی زیاتر بۆ قوتابخانە. |
| | ٧. یاریدەدەر دەتوانێت پەیوەندیەکی باش لە نێوان لە ناوەوە و دەرەوەی قوتابخانە ڕابگرێت. | ١.٧ یاریدەدەر بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لەگەڵ لێژنەکانی قوتابخانەدا کۆدەبێتەوە.<br>٢.٧ یاریدەدەر زانیاری پێویست دەدات بە مامۆستایان و کارمەندان و قوتابیان لەسەر پێشکەوتنەکانی قوتابخانەو و گوێ لە بیروبۆچونەکانیان دەگرێت.<br>٣.٧ یاریدەدەر پەیوەندیکی باشی لەگەڵ کەسوکاری قوتابیان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا هەیە. |
| | ٨. یاریدەدەر دەتوانێت تەکنەلۆژیای نوێ ی پەیوەست بە کاروباری قوتابخانەو کاری خۆی بە کار بهێنێت. | ١.٨ یاریدەدەر سیستەمی داتا بێیس بەکار دێنێت بۆ شیکردنەوەی زانیارییەکان.<br>٢.٨ یاریدەدەر دەتوانێت هۆیەکانی تەکنەلۆژیاو زانستی سەردەمیانەی پەیوەست بەکارەکانی قوتابخانە بە کار بهێنێت .<br>٣.٨ یاریدەدەر دەتوانیت هۆیەکانی پەیوەندی و گەیاندنی سەردەمیانە بە کاربهینیت |
| بەهاو رەفتارەکان | ١. یاریدەدەر پابەندە بەبەرزکردنەوەی ئاستی فێربوون و فێرکردن لە قوتابخانە. | ١.١ یاریدەدەر زانیاری بابەتیانە لەسەر ئاستی فێربوون و فێرکردن ئامادەدەکات.<br>٢.١ یاریدەدەر چاودێری ڕێژەی دەرچوون لە تاقی کردنەوە دەکات و کار دەکات بۆ بەرزکردنەوەی.<br>٣.١ یاریدەدەر دڵنیا دەبێت لەوەی کە قوتابی چەقی پرۆسەی فێربوون و فێرکردنە. |
| | ٢- یاریدەدەر پابەندە بە لە پاڵپشتی کردنی بەڕێوەبەرو لە ئەستۆ گرتنی ئەو بەرپرسیاریەتیەی کە پیَ ی ڕادەسپێردرێت. | ١.٢ یاریدەدەر نمونەیەکی باشەو کارەکانی ئاماژەن بۆ پابەندبوون بە بەها ئەخلاقی و نیشتمانی ، پەروەردەیی و پیشەییەکانەوە.<br>٢.٢ یاریدەدەر لەکاتی دەوامدا ئامادەیەو بە ڕێکوپێکی پۆل و شوێنەکانی دیکەی قوتابخانە بەسەر دەکاتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| | | ٣.٢ یاریدەدەر پالپشتی بەڕێوەبەر دەکات لە کاروباری قوتابخانەدا . |
| | ٣- یاریدەدەر پابەندە بە بەشداری پێ کردنی کەسوکاری قوتابیان و کۆمەڵگەی ناوچەکە لە چالاکیەکانی قوتابخانەدا. | ١.٣ یاریدەدەر بە شێوەیەکی کارا بەشداری لە کۆبوونەوە لەگەڵ کەسوکاری قوتابیان و ئەندامانی دەستەی کۆمەڵگەی ناوخۆیی دەکات بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر کێشەکانی قوتابخانە. |
| | ٤- یاریدەدەر پابەندە بە دادوەری و بابەتی بوون لە بەڕێوەبردنی قوتابخانەدا و هاوکارە لە چاودێری کردنی ئەدای مامۆستاو کارمەنداندا. | ١.٤ یاریدەدەر دادوەرانە و بە ڕێزەوە لەگەڵ قوتابیاندا مامەڵە دەکات.<br>٢.٤ یاریدەدەر ڕێساو ڕێنماییەکان بابەتییانە جێ بە جێ دەکات بە بێ جیاوازی. |
| | ٥-یاریدەدەر پابەند دەبێت بە خودهەڵسەنگاندن و پێشکەوتنی پیشەیی خۆیی و کارمەندانی قوتابخانە. | ١.٥ یاریدەدەر ڕاستگۆیانە خود هەڵدەسەنگاندن دەکات.<br>٢.٥ یاریدەدەر بەشداری دەکات لە چالاکیەکانی بونیات نانی تواناو پەرەپێدانی پیشەییدا.<br>٣.٥ یاریدەدەر هانی مامۆستایان دەدات بۆ خودهەڵسەنگاندن و بەشداری کردن لە ڕاهێنان و پەرەپێدانی پیشەییدا.<br>٤.٥ یاریدەدەر سەردانی یاریدەدەرانی بەڕێوەبەرانی تر دەکات بۆ ئاڵوگۆڕی شارەزاییان و هانی مامۆستایان دەدات سەردانی یەکتر بکەن بۆ لەیەکتر فێربوون و باش کردنی کارەکانیان.<br>٥.٥ یاریدەدەر بیری فراوانە و کراوەیە و هەموو شتێکی نوێ و بە سوود لە پیشەکەی خۆیدا وەردەگرێت. |
| | ٦- یاریدەدەر پابەندە بە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیاو زانستی سەردەمیانەی نوێ ی پەیوەست بە کاروباری قوتابخانە. | ١.٦ یاریدەدەر بەشیوەی ئەرینی مامەڵە لە گەل تەکنەلۆژیای سەردەمیانە دەکات لە قوتابخانە.<br>٢.٦ یاریدەدەر نموونەو پابەنەدە بۆکارهینانی هۆیەکانی پەیوەندی و گەیاندن و رەخساندنی بۆ کارمەندانی قوتابخانە.<br>٣.٦ یاریدەدەر هانی قوتابییان و دایبابان دەدات بۆ ئەوەی هۆیەکانی گەیاندن و پەیوەندی کردنی سەردەمیانە بە شێوەی تەندروست بە کاربێنن . |